**زنجیرەی مێژوو بۆ لاون (٨)**

**ناوی کتێب: دوو جەنگی جیهانی**

**نووسەر: داڤید کیڵینگرەی**

**لە ئینگلیزیەوە: مەعصومە** طرفه

**لە فارسیەوە: ئاگری ئەفشین**

**چاپ: ئەلیکترۆنی**

**ساڵ : ٢٠١٧**

# ناوەڕۆك

پێشەکی

هاوسەنگی ناجێگیری هێزی جیهانی

دەستپێکی هەوەڵین جەنگی جیهانی

بەرفراوانبوونی جەنگ

جۆرێکی نوێی جەنگ

کاریگەریەکانی جەنگی گەورە

گەڕان بە دوای ئاشتی

جەنگی جیهانی دووەم

دەستپێکی جەنگی ئەوروپی تا ١٩٤١

دەستپێکی جەنگی ئاسیا تا ساڵی ١٩٤١

جەنگی ئەوروپی لە ١٩٤١ تا ١٩٤٥

جەنگ لە ئاسیا و لە زەریای هێمن لە ١٩٤١ تا ١٩٤٥

جەنگی تەواو

جیهان لە دوای جەنگ

## پێشەکی:

لە سەرەتای نیوەی سەدەی بیستەم، دوو جەنگی گەورە ڕوویاندا. یەکەمیان، لە ساڵی ١٩١٤تا ١٩١٨ بە شێوەی سەرەکی لە ئەوروپا ڕوویدا" دووەمیشیان هەم ئەوروپای گرتەوە(لە ١٩٣٩ تا ١٩٤٥) و هەم ئاسیاشی گرتەوە( لە ١٩٣٧ تا ١٩٤٥). لە گەڵ ئەوەی هەر دوو جەنگەکە لە چەند خاڵێکی سنورداری جیهان ڕوویاندا، بەڵام بە "جەنگی جیهانی" ناودەبرێت.

جەنگی مەترسیداری زۆر لە سەدەی نۆزدەیەم ڕوویدابوو بەڵام جەنگی جیهانی هەوەڵ بە تەواوی لە گەڵ جەنگەکانی دیکە جیاوازی هەبوو. جەنگەکانی سەدەی نۆزدەیەم بە گشتی جەنگی ناوچەیی نێوان دوو یان سێ وڵات بوو و کاریگەری لە سەر وڵاتەکانی دیکە نەبوو، لە حاڵێکدا بۆ نموونە لە جەنگی جیهانی یەکەم زۆرێك لە وڵاتەکان دووچاری جەنگ بوون و کاریگەریەکەی لە تەوای دونیا هەستی پێدەکرا. بۆچی وابوو؟

لەسەدەی نۆزدەیەم، ئامرازی پێشکەوتووتر لە بواری هێڵەکانی پەیوەندی وڵاتەکانی دونیای لە گەڵ یەکتر نزیکتر کردبووەوە. دەوڵەتە پیشەسازیەکانی ئەوروپا، دەستیان بەسەر دونیادا گرتبوو. لەشکرە بەهێزەکان، هێزی دەریایی بەتوانا و موستەعمەرەی زۆر لە سەرانسەری دونیا هێزی زۆری پێدابوون. پێشکەوتنی ئابووری ئەوان پەیوەست بوو بە کڕین وفرۆشتنی کاڵا، سەرمایەگوزاری لە ئەمریکا، ئاسیا و ئەفریقا. بابەتە دارایی وبازرگانیەکانی دونیا لە شارەکانی ئەوروپا جێبەجێ دەکران. لەم ڕووەوە کاتێك دەوڵەتە گەورەکانی ئەوروپا لە گەڵ یەکتر دەکەوتنە جەنگەوە باقی وڵاتەکانی دیکەش بەهەمان شێوە دەکەوتنە ناو ئەم جەنگەوە.

## هاوسەنگی ناجێگیری هێزی جیهانی

لە ساڵی ١٨٥٠ چوار هێزی گەورە لە ئەوروپا هەبوو: بەریتانیا، فەڕانسە، نەمسا و ڕوسیە. فەڕانسە و بەریتانیا وڵاتانی گرنگی پیشەسازی بوون. لە گەڵ گەیشتنی ساڵی ١٩٠٠، گۆڕانکاری ئابووری و سیاسی لە ئەوروپا ڕوویدابوو. ژمارەی دانیشتوان ڕووی لە زیادبوون کردبوو و پیشەسازیش تەشەنەی کردبوو، بەتایبەت لە ڕوسیە و ئەڵمان پێشکەوتنیان بە خۆوە بینیبوو. ئەڵمان و ئیتالیاش ببوونە هاوپەیمان. (بگەڕێوە بۆ کتێبی بیسمارك لەم زنجیرەیدا). لە گەڵ هاتنی ساڵی ١٩٠٠، ئەڵمان دەوڵەتێکی گرنگی پیشەسازی و سەربازی ئەورپا بوو. ئەم گۆڕانکاریە لە هاوسەنگی هێزی ڕوو لە زیادبوونی نێوان هێزە گەورەکان لە سەر بازرگانی و موستەعمەرات، بۆیە هۆی گومان بردنی خراپی نێونەتەوەیی.

تەبایی وئاشتی ئەوروپا، بە هۆی تەشەنەی ناسیۆنالیستی کەوتبووە مەترسیەوە. زۆرێك لە نەتەوەکان بە تایبەت لە ڕوسیە، نەمسا-هەنگاری و ئیمپراتۆری عوسمانی سەربەخۆییان بەدەست نەهێنابوو. ئەوان لە فەرمانڕەوایی دەرەکی بەسەریانەوە بێزاربوون و هەوڵی ئەوەیان دەدا نەخشەی سنورەکانی ئەوروپا گۆڕانکاری تێ بکەوێت. لە جەنگەکانی باڵکان کە ١٩١٢—١٩١٣ ڕوویدا تورکەکانی عوسمانی شکستیان هێنا و تەقریبەن لە ئەوروپا دوورکرانەوە.




**جەنگی جیهانی ئەوەڵ لە ئەوروپا و باکوری ڕۆژئاوای ئاسیا لە ١٩١٤ تا ١٩١٨**

**ناکۆکی نێوان وڵاتەکان لەسەدەی نۆزدەیەم زۆرجار بە هۆی کۆبوونەوەی ڕێبەرانی هێزە گەورەکان کە بە" هەماهەنگی ئەوڕپا" ناودەبرا، چارەسەر دەکران. بەڵام کێشەکانی دەیەی ١٩٠٠ لە ئەوروپا هاتبوونە پێش، ئیتر بەو شێوەی پێشتر لە ڕێگای دیپلۆماسی نەدەکرا چارەسەر بکرێن. یەکێتی هێزی قودرەتمەند پەیدا بوون. لە لایەکەوە فەڕانسە لە گەڵ بەریتانیا یەکێتیەکیان پێکهێنابوو، و لە لایەکی دیکەوە ئەڵمان و نەمسا—هەنگاریا لە لایان ئیمپراتۆریەتی عوسمانی پشتیوانی دەکران. هەرتکلا سوپا وهێزی دەریایی خۆیان بە هێزتر دەکرد، و هەرئەمەش بووە هۆی گومان بردنی خراپ و خۆشکردنی ئاگری جەنگ.**

**دوو وڵاتی دیکە کە ئەوروپی نەبوون واتە ئەمریکا و ژاپۆنیش لە بواری پیشەسازی گەشەیان کردبوو. لە ڕیزی وڵاتانی گرنگی جیهان بوون. نەتەوە یەکگرتووەکان سەرچاوەی گەورەی مادەی خاو، خۆراک، کرێکاری شارەزا و شتی دیکەی هەبوو.**



**سەربازە جەزایریەکانی ژێر دەسەڵاتی فەڕانسە لە کاتی دروستکردنی ڕێگای ئاسنی لە بەرەی ڕۆژهەڵات لە جەنگی جیهانی یەکەم. فەڕانسە، بەریتانیا، ئەڵمان و بەلجیکاهەموویان سەرزبازیان لە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی خۆیان لە ئاسیاوە دەهێنا.**

**سەربازە فەڕانسیەکان لە کاتی پێشڕەوی لە نێوان تێلدڕوەکان کە لە بەردم خۆیان بۆ پارێزگایکردن دایانابوو تا ئەوەی هێرش بکەنە سەر بەرەی ڕۆژئاوای ئەڵمان لە ساڵی ١٩١٥.**



سەربازە ئەڵمانیەکان ئەو کاتەی لە سەنگەرەکانیان چاوەڕێن هێرش بکەنە سەر ڕوسیە. لە جەنگی تانینبرگ لە سەرەتای جەنگ یەکەمی جیهانی ڕوسەکانیان شکست پێهێنا.

ژاپۆنیش بە هۆی شکست پێهێنانی ڕوسیا لە ساڵی ١٩٠٥ هێزی خۆی نیشان دابوو. (مۆدێرنیزەکردنی ژاپۆن لەم زنجیرەیە). هەردوو وڵات بە ڕێژەی پێویست هێزیان بەدەست هێنابوو کە بکەونە جەنگەوە لە گەڵ هێزی جیهانی ئەوروپا.

## دەستپێکی هەوەڵین جەنگی جیهانی

لە ساڵی ١٩١٤ جەنگ لە نێوان هێزە گەورەکانی ئەوروپا ڕویدا. هۆکاری سەرەتایی جەنگ، ناکۆکی نێوان نەمسا-هەنگاریا و وڵاتی هاوسێ سەربیا بوو. نەمسا-هەنگاریا بە هۆی هاندانی ئەڵمانیا نیازی هەبوو سربیا داگیر بکات. ڕوسیە پەیوەندی نزیکی هەبوو لە گەڵ سربیا و بە هیچ جۆرێك ڕێگەی بەم دەستدرێژیە نەدەدا. کەوابوو، ئامادەی بۆ جەنگ نیشاندا. ئەڵمان کەوتە مەترسیەوە، لەبەرئەوەی ترسی ئەوەی هەبوو کە لە کاتی هێرشی ڕوسیە لە ڕۆژهەڵاتەوە، فەڕانسە پشتیوانی لە ڕوسیە بکات، لە ڕۆژئاواوە هێرش بکاتە سەر ئەڵمان. نەخشەدارێژەرانی سەربازی ئەڵمان نەخشەیەکیان کێشا کە بە پێی ئەوە سوپای ڕێکخراوی ئەوان لە بەلجیکا جێگیر بکرێت و زۆر بە خێرای فەڕانسە شکست پێ بهێنێ و دواتر لە ڕۆژهەڵاتەوە هێرش بکەنە سەر ڕوسیا.

ئەم نەخشەیە شکستی هێنا و بەریتانیا هات بۆ هاوکاری فەڕانسە و ڕوسیە. لە گەڵ گەیشتنی بەهاری ١٩١٥ ئەڵمان، نەمسا-هەنگاریا و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە گەڵ فەڕانسە، بەریتانیا، ڕوسیا، ئیتالیا و ژاپۆن، زۆرێك لە دەوڵەتانی ئەوروپای و دەوڵەتانی غەیری ئەوروپایش لە جەنگدا بوون.

## بەرفراوانبوونی جەنگ

هەوەڵین جەنگی جیهانی ئەوروپا، زیاتر جەنگی زەمینی بوو؛ هەروەها لە حکومڕانیەتی عوسمانی و موستعەمەرەکانی ئەڵمانی لە ئەفریقا و لە دەریا جەنگ ڕوویدا. لە جەنگی ١٩١٤ زۆرێك لە سەرکردە سەربازیەکان باوەڕیان وابوو کە جەنگی نێوان هێزە گەورەکان کورتخایەن دەبێت. ئەوان زۆر لە هەڵەدابوون. لە ڕاستیدا، هەروەك زۆر کەس پێشبینیان کردبوو جەنگی گەورە لە گەڵ جەنگەکانی دیکە زۆر جیاوازی هەیە.

لە نەخشەی لاپەڕە () دەبینریٚ بەرەی جیاواز هەبووە. بەشی گەورە جەنگ لە دوو بەرە بوو لە چەند سەد کیلۆمەتری ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوای ئەوروپا. لە بەشی ڕۆژهەلات لەشکری پێشکەوتووی ئەڵمان توانی بەرەو ڕوسیە پێشرەوی بکات. سنعەتی ڕوسیا زۆر دواکەوتووتر بوو لە زۆربەی ولاتانی نوێی ئەو کاتە هەرچەند ڕوسیا لەشکرێکی گەورەی هەبوو بەلام زۆر ڕێکخرا و بەهێز نەبوو.

لە ساڵی ١٩١٦ ڕوسیە چەند سەرکەوتنێکی بەدەستهێنا بەسەر نەمسا و تورکیا بەلام چەند شکستێکی گەورەیشی بە خۆوە دیت کە ماندووی کرد و لە توانا بڕابوو. هەزاران سەرباز سوپایان جێهێشت و ولات لە لێواری شوڕشێك بوو.(بگەڕێوە بۆ شۆڕشی ڕوسیە لەم زنجیرەیدا)

بارودۆخی بەرەی ڕۆژهەلات بە تەواوی جیاواز بوو. لە جیاتی جەنگێکی جولاو لە شوێنی خۆیان کە لە شارەکان وجێگە گرینگەکان داگیر دەکەن، هیچ کام لەوان توانای شکستی یەکجارەکی ئەوی دیکەی نەبوو. لە سەرانسەری ئەو بەرەیەی کە لە بەلجیکاوە تا فەڕانسەی گرتبۆوە، سەربازەکانی هەر دوو سوپا سەنگەریان هەڵقەند و لە پشت تێل دروەکانەوە بەرامبەر یەکتر وەستانەوە. سەنگەرەکان لە هاوینان وشك وبرینگ و خۆڵاوی بوو؛ بەلام لە زستان پڕ دەبوو لە ئاو قوڕ و چڵپاو کە دەرچوون تێیدا مەحاڵ بوو. ئاڵمان و هاوپەیمانانی دەیانهەویست هەرچی زووە بە هۆی هێرشی گەورەوە سەرکەوتن بە دەست بێنن. لەم جەنگە بەرفراوانانە هەزاران چەکی قورس پێکەکانی دوژمنیان خستە ژێر ئاگر و سەربازەکان هێرشیان بردە ناو سەنگەرەکانی یەکترەوە. ئەم جەنگە وەحشیانە چوار ساڵ بەردەوامی هێنا. جەنگەکانی کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەم لە پێشدا نیشانی دابوو کە هێرش کردن بە نیزە و سوود وەرگرتن لە سوار بەرامبەر سەربازانی کە پەرچەککراوان بە چەکی پێشکەوتووتر بێ سوود بوو. بەلام هێشتا لە گەڵ ئەوەشدا فەرماندەکانی جەنگ هێشتا لە بیری هێرشی گەورەی هێرشبەرانە بوون تا ئەوەی کە پارێزگاری بکەن. کوشتارێکی وەحشیانە و سامناك بوو بەلام بە سەختی پێشڕەویان دەکرد. بۆنموونە ڕۆژی هەوەڵی هێرشی (سووم، ڕوبارێکە لە باکوری فەڕانسە)لە ٧/١٩١٦، ٦٠٠٠٠ نەفەر قوربانی لێ کەوتەوە. هەتا ١١/١٩١٦ کۆی کوژراوەکانی هاوپەیمانان و ئەڵمان لە جەنگی (سووم) نزیکەی یەك ملیۆن و دووسەد هەزار نەفەر بوو. زیانی لەم جۆرە پێویستی بە سوپای گەورەوە هەبوو. ملیۆنان نەفەریان بردە سەربازی و ناردیانە مەیدانەکانی جەنگ. لە بەرەی ڕۆژئاوا بارودۆخەکان ئەوەندە مەترسیدا بوون کە هەموو بەشەکانی سوپای فەڕانسە لە ساڵی ١٩١٧ شۆڕشیان کرد.

لە ساڵی ١٩١٧ ئەمریکا هاتە ناو جەنگەوە دژ بە ئاڵمان. بەر لەوەی ئەمریکا بە شێوەی ڕاستەوخۆ بێتە ناو جەنگەوە، کە خوازیاری سەرکەوتنی بەریتانیا و فەڕانسە




کەشتیەکی ئاسمانی بەریتانی لە کاتی پارێزگاری کردن لە کەشتیەکی بازرگانی. بە درێژای دوو جەنگی جیهانی ملیۆنان تۆن پێداویستی بە هۆی ژێردەریایەکانەوە ژێر ئاو کەوتن. کەشتیە جەنگیەکان و فڕۆکەکان کە پارێزگاریان لە کەشتیە بازرگانیەکان دەکرد، ڕێگریان لە زیانەکان دەکرد.

بوو،پێداویستی خۆراك، پۆڵاو گولەی پیَ دەفرۆشتن. ئاڵمان کە هیچ هاوپەیمانێکی نەبوو، پشت بە سەرچاوە پێویستەکانی وڵاتانی دیکە ببستێت. هێزی دەریایی بەریتانیا ڕێگاکانی دەریای کۆنترۆڵ کردبوو ڕێگری دەکرد لە هەرشتێك کە چووبایە بۆ ئاڵمان. ئەم ڕێگری کردنە بووە هۆی کەمبودی زۆر لە وڵاتانی ئەڵمان، و نەمسا و هەنگاریا. هێزی دەریایی ئاڵمان توانای ڕووبەڕوبونەوەی لە گەڵ هێزی دەریای بەریتانیا نەبوو. بەڵام ئاڵمان ژمارەیەك زۆر ژێردەریایی هەبوو کە بۆ ژێر ئاو خستنی کەشتیە بازرگانیەکان سوودی لیَ دەبینی، ئەو کەشتیانەی کە دەچوون بۆ بەریتانیا و فەرانسە. ئەڵمان کە هیچ چارەیەکی دیکەی نەبوو بۆ ڕزگارکردنی خۆی لە ساڵی ١٩١٧ بڕیاریدا نە تەنها کشتیەکانی بەریتانیا بەڵکۆ کشتی وڵاتانی بیَ لایەنیش ژێرئاوبخەن. زۆرێك لە کەشتەیەکانی ئەمریکا غەرق بوون و پێی ئەمریکاشیان کێشایە ناو جەنگەوە.




**ژنانی کرێکار لە کارخانەیەکی ماتۆڕدروستکردن لە بەریتانیا لە ساڵی ١٩١٧. لە سەردەمی هەر دوو جەنگەکە ژنان دەستیان کرد بە کارکردن لە هەندێك کارگە کە پێشتر تەنها پیاوەکان ئەم جۆرە کارانەیان دەکرد.**

**لەم نێوانەدا، لە کۆتایدا ڕوسیە شکستی خوارد بوو و پەیمانی ئاشتی بە جیا ئیمزا کردبوو. ئەڵمان خەیاڵی ئەوەی کردبوو کە دەتوانێ لەشکرەکەی لە ڕۆژهەلاتەوە بەرەو ڕۆژئاوا بجولێنێت و بەرلەوەی سوپای ئەمریکا بگەن، شکت بە بەریتانیا و فەڕانسە بهێنێت. بەلام هێرشی گەورەی ئالمان لە ساڵی ١٩١٨ ڕووبەڕوی شکت بوویەوە . ئالمان کە لە جەنگ کردن تەواو ماندوو ببوو، لە ساڵی ١٩١٨ ئامادی بۆ ئاتەش بەس ڕاگەیاند.**

## جۆرێکی نوێی جەنگ

**جەنگی جیهانی ئەوەڵ بە بەراوەرد لە گەڵ جەنگەکانی پێشتر جیاوازی زۆری هەبوو. هەوەڵ ئەوەی کە لە هەر جەنگێکی دیکەی پێشتر گەروەتر بوو. خەڵك ناویان لێنابوو(جەنگی گەورە). ملیۆنان سەربازیان ناردە بەرەکانی جەنگ. ژمارەی قوربانیانی جەنگ زۆر زیاتر لەوە بوو کە بیریان لێدەکردەوە. |(هەڵبەت قوربانیەکانی ئەم جەنگە بە قەدەر قوربانیەکانی ئەنفلۆزا نەبوو کە لە نێوان ساڵەکانی ١٩١٨ تا ١٩٢٠بوو، کە بە ئەنفلۆنزای**



**تانکێک لە کاتی چالاکی لە بەرەی ڕۆژئاوا، لە ساڵی ١٩١٧. لە جەنگی جیهانی دووەم، ئەڵمان زۆر کارزانانە تانکەکانی بەکارهێنا لە شکست پێهێنانی فەرەنسە و هێرش کردنە سەر ڕوسیا.**

**ئیسپانیا بە ناوبانگە بەلام چەندین وڵاتی جیهانی گرتەوە و دەوترێت قوربانیەکان لە نێوان ٥٠ تا ١٠٠ ملیۆن نەفەر بووە)، دووهەم، ئەم جەنگە، جەنگی وڵاتانی پیشەسازی بەهێز بوو. تەنها وڵاتە پیشەسازیە نوێیەکان بوو کە توانای دەستەبەر کردنی ئەو هەموو پێداویستی جەنگ و خۆراك و جلوبەرگی سوپیان هەبوو ئەویش بۆ جەنگێکی درێژخایەن. ئەڵمان، بەریتانیا، فەرەنسە و ئەمریکا هێزی ئابووری جەنگی لەو جۆرەیان هەبوو. لە لایەکی دیکەوە ڕوسیە، گەرچی لەشکرێکی گەورەی هەبوو، بەڵام نەیدەتوانی پێداویستیەکانی جەنگ دابین بکات بۆ بەردەوامی دان بە جەنگ. کەوابوو جەنگی نویٚ ئەو مانایەی هەبوو کە هەوڵ کرێکاری کارخانەکان وکێڵگەکان هەمان گرنگی سەربازەکانی ناو جەنگیان هەبوو. دووهەم: یەکێك لە ڕێگا سەرەکیەکان زاڵ بوون بوو بەسەر دوژمنەوە بە هۆی لە ناوبردی ئابووری دوژمنەکەی. کەوابوو هەر دوو بەرەی جەنگ تێدەکوشان دەست بەسەر کاڵا هاوردەکانی یەکتردا بگرن. کەم کەم حکومەتی وڵاتە پیشەسازییەکان تەواوی ئابووری خۆیان لە سەر پێویستیەکانی جەنگ بەرنامەڕێژی کردبوو. سەنعەتە نوێیەکان گەشەی بە خۆوە**

**بینی ئەویش بە هۆی پیداویستەکانی جەنگ و مادەی کیمیایەکان. خۆراکی زیاتر بەرهەمهێنرا و بێکاری ڕووی لەکەمی کردوو و ژنەکان لە زۆرێك لە کارەکان سەرقاڵی کارکردن بوون کە پێشتر مافی ئەوەیان نەبوو لەو شوێنانە کار بکەن. دەوڵەتەکان کۆنترۆڵی زیاتریان بەسەر خەڵکەوە کرد. باجی زیاتریان دا و موچەو نرخەکان ڕوویان لە زیادبوون کرد. ژمارەی کارمەندانی حکومەت ڕووی لە زیادبوون کرد.**

**سێیەم، هەموو جۆرە چەکێکی نویٚ لە جەنگەکان تاقیکرانەوە. هێزی ئاگر و کاریگەری تفەنگەکان زیادی کرد. تۆپخانەی کەوەرە چەکەکان، زۆر زیاتر لە جەنگەکانی پێشتر قوربانی خستەوە. غاز کە جۆرێك بوو لە چەکی نویٚ و کوشەندە بوو، لە وەختی جەنگ بە شێوەی بەرفراوانتر بەکارهات. داهێنانی ڕێگای شەمەندەفەر، بارهەڵگری کە بە ماتۆڕ کاریان دەکرد، جێگای عەرەبانەی ئەسپداریان گرتەوە و لەشکر دەیتوانی بە ئاسانی لە**




**وڵاتە نوێیەکانی ئەوروپا و باکوری ڕۆژئاوای ئاسیا، ١٩٢١.**

**شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە بگوازنەوە. ماتۆڕی بەنزین کە تازە دروست کرابوو لە تانگەکانی زنجیری بەکارهاتن و بۆ هەوەڵین دەفعە لە بەرەی ڕۆژئاوا بەکارهێنرا. لەسەرەتای جەنگ، هێزە گەورەکان تەنها چەند فڕۆکەیەکی بچوکیان هەبوو. بەڵام لە ساڵی ١٩١٨ فڕۆکەکان ئامانجە مەدەنیەکانی دوژمنیان بۆمباران دەکرد و کەشتیە هوایەکانیش سوودیان لە فڕۆکەی بۆمب هاوێژ وەردەگرت. لە دەریادا، گرنگی کەشتی گەورەی جەنگی ڕووی لە کەمی کرد و لە جیاتی ئەوە ژێردەریایی پێشکەوتوو و کەشتی زەبەلاح یاخود *توربید* و کەشتی نوێ کە دەیتوانی ژێردەریایەکان ڕاوبکات و لەناویان بەرێت، وەکو شێوەی جەنگی نوێ کەڵکیان لێوەرگیرا. هەموو کەشتیە جەنگیە نوێیەکان لە جیاتی خەڵوز بە دیزل کاریان دەکرد. چەکی نوێ پێویستی بە نەفت و پلاستیك هەبوو. لەبەرئەوە داگیر کردن و کونتڕۆڵ کردنی ئەو ناوچانە کە ئەم مادە خاوانەی لێ بوو بۆ تەواو کردنی بابەتی جەنگی زەروری بوو.**

کۆمەڵەی نەتەوایەتی لە دانیشتنی ژنێڤ لە دەیەی ١٩٣٠. زۆرێك لە ولاّتانی ئەندام هومێدەوار بوون کە هاکاری ولاّتان بە هۆی کۆمەڵەی نەتەوایەتی کاریگەری هەبێ لە ڕێگریکردن لە جەنگ. ئەم دانیشتنە کە پێی دەوترا ئەمنیەتی بە کۆمەڵ لە دەیەی ٣٠ نەیتوانی سەرکەتوو بێت لە سەرهەڵدانی جەنگ.

## کاریگەریەکانی جەنگی گەورە

جەنگ، توانای لە ولاّتانی ئەوروپای بڕیوو. حکومەتە گەروەکانی وەکو ڕوسیە، نەمسا-هەنگاریا، تورکیە و ئاڵمانیش لە دوای شکستیان لە جەنگ بەرەوهەڵدێران چوون. چەندین حکومەتی نەتەوەی نوێ لە ناوەڕاست و ڕۆژهەلاّتی ئەوروپا دروست بوون. گرنگترینی ئەوانە، چێکسلاوکی و پۆڵەند لە ئەوروپا. تورکیەش بوو بە ولاّتێکی بچوکتر. چەندین ناوچەی گەورە لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆژئاوای ئاسیا یان سەربەخۆیی خۆیان وەرگرت یان کەوتنە ژێر دەسەلاّتی بەریتانیا و فەڕانسە. (ئەتاتورك لەم زنجیرەیەدا)

لە کۆنفرانسی ئاشتی، هاوپەیمانان ئەڵمانیایان وەکو تاوانباری سەرهەڵدانی جەنگ تۆمەتبار کرد. لەبەر ئەوە پێداگر بوون لەسەر ئەوە کە ئاڵمان دەبێ لاواز بکرێت و جەریمەش بدات. ئاڵمان، بەشێکی لە خاکەکەی لە ئەوروپا و ناوچەکانی ژێردەستیشی لە موستەعمەراتەکانی دیکە لە دەستدا. وە دروستکردنی سوپای گەورەشی لێ قەدەغە کرا. ئەم بارودۆخە توڕەبوونێکی زۆری لە لای ئەڵمانیەکان دروستکرد. زۆرێك لە ولاّتانی دیکەی ئەوروپای وەکو ئیتالیا و شوڕەوی لەم بارودۆخە نوێیەی جەنگ گلەیان هەبوو و دەیانویست ئەو سنورەی کە بۆیان دیاریکراوە بیگۆڕن.

جەنگ زیانی بە بازرگانی دەرەکی گەیاند و زۆرێك لە ولاّتانی ئەوروپا بازاری سەرمایەگوزاریان لە دەرەوەی ئەورپا لەدەستدا. لەو ناوچانەی کە جەنگ نەبوو، دەوڵەتەکان توانیان سوودمەند بن لە جەنگ. بۆنموونە کاتێك بەریتانیا ئیدی نەیدەتوانی کالاّکانی بەنی(جلوبەرگی دروستکراو لە بەن) بنێرێت بۆ ئاسیا، ئەم بازارە کەوتە دەست ژاپۆن و هیندستان. لە پاش جەنگ، دەوڵەتە نوێیەکانی ئەورپا نوێکاریان لە پیشەسازیەکانی خۆیاندا کردەوە و بە سنوردارکردنی



هیتلەر، دیکتاتۆری ئەڵمان. لە کاتی وتاردان لە کۆبونەوەیەکی گەورە لە نورینبرگ ساڵی ١١٩٣٨. ئەڵمان لە ژێر حوکمڕانی هیتلەر زۆر بە خێرای نوێکاری چەك و چۆڵی کرد. سەربازی کۆکردەوە و هێزێکی سەربازی گەورە و هێزی ئاسمانی بە توانای بونیادنا.

هاوردەکردنی کاڵای دەرەکی پشتیوانیان لە بەرهەمی ناوخۆ کرد. هەروەها وڵاتانی ئەوروپایی ناچار بوون کە سەرمایە دەرکیەکانی خۆیان بفرۆشن تا بودجەی پێویست بەدەست بێنن بۆ کڕینی مادەی خاو بۆ دروست کردنی کەل و پەلی جەنگی. لە ساڵی ١٩١٣ وڵاتە پیشەسازیەکانی ئەوروپا پارەیان لە هەموو وڵاتانی جیهان وەردەگرت. بەڵام لە کۆتایەکانی جەنگ تەقریبەن هەموویان زیاتر قەرزداری ئەمریکا بوون. نەتەوە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دوای جەنگی جیهانی ئەوەڵ دەوڵەمەندتر بوو لەو کاتەی کە نەهاتبووە ناو جەنگەوە، واتە لە بارودۆخێکدا بوو کە بتوانێ ڕۆڵێکی گرنگ بگێڕێ لە جیهاندا. ئەمریکا نەیدەویست ئەو کارە بکات و لەبەر ئەوە پشتی لە ئەوروپا کرد. لە ئەنجامدا، یەکێك لە گرنگترین کاریگەریەکانی جەنگی جیهانی هەوەل-تێپەڕینی هێزی جیهانی لە ئەوروپاوە بۆ ئەمریکا-بۆ یەك چارەگە سەدە دوا کەوت.

بارودۆخی سەردەمی جەنگ، خێرایی لە گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی و سیاسی کرد. ملیۆنان لە خەڵکی مەدەنی بەشداریان لە جەنگدا کردبوو. حکومەتەکان زیاتر مەیلیان لەوەبوو گرنگی بە بواری تەندروستی وپەورەدەی هاوڵاتیەکانیان بدەن. خەڵکی ئاسایی زیاتر خوازیاری ئەوەبوون دەست لە کاروباری حکومەت وەردەن. ژن و پیاوی کرێکاری وهەژار مافی دەنگدانیان بەدەستهێنا. لە پاش جەنگ بۆ یەکەم جار لە ئاڵمان و بەریتانیا زۆرێك لە وڵاتانی دیکەی ئەورپاحکومەتی سۆسیالیستی هاتە سەرکار.



**خانوەکانی بە هۆی بۆمبارانی جەنگەوە وێران بوون لە ئیسپانیا لە ١٩٣٦ تا ١٩٣٩. هێزی ئاسمانی ئەڵمان و ئیتالیا، هاوکاری ڕوسیەیان کرد بۆ لەنابردنی حکومەتی یاسای ئیسپانیا.**

## گەڕان بە دوای ئاشتی

**وێرانکاریەکانی جەنگی جیهانی یەکەم ئەوەندە ترسناک بوو کە زۆرێك لە خەڵکی باوەڕیان وابوو نەتەوەکان دەبێ چەکەکانیان دابنێن و پێکەوە هەوڵ بدەن بۆ ئەوەی ڕێ لە جەنگ بگرن. لە ساڵی ١٩٢٠ هەندێ لەو وڵاتانەی کە شکستیان بە ئاڵمان هێنابوو "کۆمەڵەی نەتەوەییان" پێکهێنا. هەوڵ ئەوەی کە ئاڵمان مافی بە ئەندامبوونی لەم هاوپەیمانیەتە نەبوو-دووهەم شوڕەویش کە کومونیستی بوو و جێگای متمانەی وڵاتانی ڕۆژئاوایی نەبوو. ئەم هاپەیمانیەتیە یان کۆمەڵەی نەتەوەی کاریگەری گەورەی هەبوو لە چارەسەرکردنی زۆرێك لە بابەتە گرنگەکانی وەکو بازرگانی و پەناهەندەیی بەڵام توانای پاراستنی ئاشتی نەبوو. کۆمەڵەی نەتەوەی سوپای نەبوو و ئەمریکاش ئەندام نەبوو تیایدا. لەدوای جەنگ، ئەمریکا هەموو لەشکرەکەی لە ئەوروپا کێشایەوە، گەرچی بەشێوەیەك چالاك لە کۆنفڕانسی دانانی چەك بەژداری کردبوو بەڵام خۆی بە دوور دەگرت لە دەستیوەردان لە بابەتی پەیوەست بە ئەوروپاوە. حکومەتەکانی بەریتانیا و فەرانسە ترسی دووبارە سەرهەڵدانەوەی جەنگیان هەبوو نەیانتوانی هاوکاری ئامانجەکانی کۆمەڵەی نەتەوەی بکەن. لەبەرئەوە لە ساڵانی ١٩٣٠ تا ١٩٤٠ ئەم کۆمەڵەیە نەیتوانی ڕێگر بێت لە هێرشی ژاپۆن، ئیتالیا، ئاڵمان و ڕوسیە بۆ سەر وڵاتانی دیکە. ژمارەیەك کۆنفڕانس زۆر لەسەربابەتی**




جەنگ لە ئەوروپا لە ساڵی ۱۹۳۹ تا ۱۹٤٥.

دانانی چەك بەسترا لە ساڵەكانی نێوان هەر دووجەنگەكە. سنورێك بۆ هێزە دریایی و ئاسمانیەكان دیاریكرا، بەڵام هیچ وڵاتێك ئامادە نەبوو دەست بكات بە دانانی چەكەكانیان مەگەر ئەوەی وڵاتانی دیكەش بێن و دەست پێبكەن. لە ناوەراستی سالاَنی ۱۹۲۰ زۆربەی وڵاتانی ئەوروپایی تۆڵەی زیانەكانی ئابووری سەردەمی جەنگیان كردبووەوە. پیشەسازیەكانی، وەكو پیشەسازی ئۆتۆمبێل و پشەسازی ئامرازی كارەبایی بە شێوەی بەرچاو گەشەی كردبوو. هەروەها پێشەسازی چەك دروستكردنیش پێشكەوتنی بە خۆیەوە بینیبوو، بە هۆی هەبوونی رێكۆردێكی جیهانی لە ساڵی ۱۹۳۰، وڵاتانە پیشەسازیەكان لە ساڵی ۱۹۳۹ بارودۆخێكی زۆر باشتریان هەبوو لە چاو ساڵی ۱۹۲۰.

جەنگ لە ئاسیا و زەریای هێمن لە ساڵی ١٩٣٧ تا ١٩٤٥

کەشتی جەنگی یو.ئێس.ئێس کالیفۆرنیا دوای هێرشی ژاپۆن لە ١٩٤١/١٢ لە پڕهاربۆر ژێرئاو کەوت. ئەم هێرشە لە ناکاوەی ژاپۆنیەکان بە شێوەی کاتی سودی پێگەیاندن لە زەریای هێمن.




ریزڕاوەستان بۆ وەدەستهێنانی نان لە فەڕانسەی ژێر دەسەڵاتی ئەڵمان، لە جەنگی جیهانی دووەم لە کاتی جەنگ خۆراك و زۆرێك لە کاڵاکانی ناو ماڵ بە ڕێژەیەکی کەم بەرهەم دەهات. لە هەردوو جەنگەکە لە بەشی زۆری ئەوروپا قاتوقوڕی هاتە پێشەوە بەڵام زۆربەی خەڵکی بەریتانیا تاڕادەیەك خۆراکی باشیان هەبوو.

## جەنگی جیهانی دووەم

جەنگی جیهانی دووەم، دووجەنگی جیاواز بەڵام لە هەمان کاتدا زۆر پەیوەست بوون بە یەکترەوە، لە ئەوروپا و ئاسیا ڕویاندا. لە ئەوروپا، باکوری ئەفریقا و زەریای ئەتڵەس، ئەڵمان و ئیتالیا و تەقریبەن هەموو دەوڵەتەکانی ئەوروپا و دواتر لە گەڵ ئەمریکاش جەنگان. لە ئاسیاش پێشتر ژاپۆن لە گەڵ چین لە جەنگدا بوو. و لە ساڵی ١٩٤١ ژاپۆن هێرشی کردە سەر ئەمریکا، بەریتانیا و هۆڵەندا لە ئاسیا و زەریای هێمن.

## دەستپێکی جەنگی ئەوروپی تا ساڵی ١٩٤١

هیتلەر، کە لە ساڵی ١٩٣٣ لە ئەڵمان حکومەتی گرتبووە دەست و موسولینیش کە دیکتاتۆری ئیتالیا بوو هەر دوکیان دەیانویست گۆڕانکاری لە سنورەکانی ئەوروپادا بکەن. (بگەڕێوە بۆ کتێبی هیتلەر لەم زنجیرەیەدا) هیتلەر کەسێکی دڵڕەق بوو کە بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی هەمیشە ئامادەی جەنگ بوو. ئەو خێرایی لە ڕێکخستنەوەی سوپای ئەمریکا کرد و حکەمەتی ژێر دەستی خۆی فراوانتر کرد بۆ ئەوەی هەنێك لە وڵاتانی هاوسێی خۆی داگیر بکات و لەم ڕووەوە تا ساڵی ١٩٣٨ ئەڵمان جارێکی دیکە بوو بە بەهێزترین دەوڵەتی سەربازی ئەوروپا. ئیتالیا دەستی گرت بە سەر بەشێك لە وڵاتانی باکوری ئەفریقا و لە گەڵ ئاڵمان هاوپەیمانی پێکهێنا. ئەم دوو وڵاتە بە وڵاتانی تەوەر ناسران. و ئەوان لە گەڵ ژاپۆنیش هاوپەیمانیان دژ بە ڕوسیا



ڕوسەکان لە کاتی دروستکردنی شوێنی پارێزگاری، ئەوکاتەی ئەڵمان هێرشی کردە سەر لینینگراد و گەمارۆی دا. هەزاران نەفەر لەم ئابلۆقە دانە گیانیان لەدەستدا، زۆربەیان لە برسیەتی.

بەست. بەریتانیا و فەڕانسە نەیاندەویست جەنگێکی دیکە یەقەیان بگرێت لەبەر ئەوە ڕزامەندیان بۆ هەندێك لە خواستەکانی هیتلەر نیشان دا. هیتلەر دڵنیا بوو لەوەی کە هەر شتێك بیهەوێت دەتوانیّ لە ڕۆژهەلاّت و ناوەندی ئەوروپا ئەنجامی بدات. کاتێك ئاڵمان لە ساڵی ١٩٣٩ هێرشی کردە سەر پۆڵەند هیتلەر وا بیری کردەوە کە ئەم جەنگە تەنها جەنگێکی ناوچەیی بچوك دەبێت. بەڵام بەریتانیا و فەڕانسە کە بەڵێنیان بە پۆڵەند دابوو کە بیپارێزن، ئەوا دژ بە ئاڵمان جەنگیان ڕاگەیاند.

گەرچی ڕوسیا وڵاتێکی گەورە بوو، بەڵام لە دوو لاوە مەترسی جەنگی لەسەر بوو، یەکێکیان ژاپۆن لە ڕۆژهەلاّتەوە و ئەویتریان ئاڵمان لە ڕۆژئاواوە. لە ئەورپا، ڕوسیا ویستی ئەوەی هەبوو لە ڕێگای بەرفراوانکردنی سنورەکانیەوە بەرەوە ڕۆژئاوا، وڵاتەکەی خۆی بە پارێزراوی بهێڵێتەوە. شورەوی بە ڕەزامەندی ئەڵمان لە ساڵەکانی ١٩٣٩ و ١٩٤٠ بەشێکی لە پۆڵەند و چەند بەشێکیشی لە خاکی ئەوروپا داگیر کرد. (بگەڕێوە بۆ کتێبی ستالین لەم زنجیرەیە) ئاڵمان بە ئاسانی لە ساڵی ١٩١٩ شکستی بە پۆڵەند هێنا. لە ماوەی یەك سالّ، ئاڵمان زۆرێك لە ولاّتانی ئەوروپای خستە ژێر دەسەلاّتی خۆی بە فەڕانسەشەوە. سەرکەوتنەکانی ئاڵمان لە ڕۆژئاوا بە سوودوەرگرتن لە تانکە جەنگیەکان بوو. فەڕانسە شکستی هێنا. بەڵام ئاڵمان نەیتوانی کۆنترۆڵی هەوای و دەریایی بگرێتە دەست لۆیە سەرکەوتوو نەبوو لە داگیرکردنی بەریتانیا. لە ساڵی ١٩٤١ ئیتالیا بە پشتوانی ئەڵمان هاتە ناو جەنگەوە. ئیتالیا لەبەرئەوەی ئاسن و خەڵوزی نەبوو نەیدەتوانی ببێتە یەکێك بە زلهێزەکانی دونیا، لەگەڵ



سەربازانی ڕوسی و ئەمریکای لە تەنیشت ڕوباری ئالْپ لە ناوەڕاستی ئەڵمانی شکستخواردوو لە ساڵی ١٩٤٥. دوای جەنگی جیهانی دووەم هەم ڕوسیەکان و هەم ئەمریکایەکان سەربازەکانیان لە ئەوروپای ناوەڕاست هێشتەوە.

ئەوەشدا سوپای ئیتالیا، نەیتوانی بوو شکست بە یۆنان بهێنێن یان نۆکەندی *سویز* لە چنگی بەریتانیا دەربهێنێت. سوپای ئەڵمان ناچار بوو لە باڵکان و باکووری ئەفریقا بچێت بۆ هاوکاری ئیتالیا.

## دەستپێکی جەنگی ئاسیا تا ساڵی ١٩٤١

لە ساڵانی ١٩٣٠ ژاپۆن تەنها وڵاتی پیشەسازی ئاسیا بوو لەبەرئەوە بەهێزترین وڵاتی ئەو ناوچەیە بوو. ژاپۆن دانیشتوانێکی زۆری هەبوو کە کرێکاری کارزان و چاکی لە خۆگرتبوو بەڵان خاڵی لاوازی ژاپۆن کەمبودی مادەی خاو بوو کە زەروری بوو بۆ پیشەسازی. ژاپۆن ناچاربوو ئەم مادەخاوانە لە وڵاتانی دەروە هاوردە بکات. زۆرێك لە سەرانی ژاپۆن لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە ژاپۆن دەبێ یان وڵاتانی هاوسێی داگیر بکات یان مەترسی لاواز بوون قەبوڵ بکات. لە ساڵی ١٩٣١ ژاپۆن، *مەنچوری* لە باکوری چین داگیرکرد. لە دوای ١٩٣٧ چین و ژاپۆن بە بەردەوامی لە جەنگدابوون. ئەمریکا، فەڕانسە، بەریتانیا و هۆڵەندا بەم فراوانخوازیەی ژاپۆن نیگەران بوون چونکە بەرفراوانبوونی ژاپۆن مەنفەعەتی ئەوانی لە ڕۆژهەڵات و باشوری ڕۆژهەڵات دەخستە مەترسیەوە. ژاپۆنیش ترسی هەبوو لەوەی ئەوروپا و ئەمریکا پشتگیری چینیان دەکرد دژ بە ژاپۆن لەکۆنترۆڵی ئەو وڵاتانە بە هۆی سەرچاوەکانی نەفت، قەڵایی و پلاستیك لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا.

جەنگ لە ئەورپا، دۆخێکی گونجاوی بۆ ژاپۆن خوڵقاند. هێزی زەبەلاحی دەریایی ئەمریکای لە زەریای هێمن، تەنها ڕێگر بوو لە سەر ڕێی ژاپۆن بۆ ئەوەی نەخشەکەی بە ئەنجام بگەیەنێت ئەویش داگیرکردنی باکوری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بوو. لەبەر ئەوە لە ساڵی ١٩٤١ هێرشی بردە سەر کشتیە دەریایەکانی ئەمریکا لە *پێرڵ هاربۆر* بە هومێدی



**لە ساڵی ١٩٤٢ بەریتانیا سەنگاپۆری تەسلیم بە ژاپۆن کرد. گەرچی سوپای بەریتانیا بەهێزتر بوو لەلاَم لەبەر وەرەی خراپی سەربازەکان و شێوازی خراپی پارێزگاری دورگەکە، لە کۆتایدا بەرتانیا شکستی هێنا. کەوتنی سەنگاپور، سەرەتای لە دەسەدانی دەسەڵاتی بەریتانیا بوو لە ئاسیا.**

ئەوەی کە ئەمریکا لە ئاسیا بچێتە دەرەوە، بەلاَم بە پێچەوانەوە بووە هۆی ئەوەی ئەمریکا بێتە ناو جەنگە و بووە هۆی شکست و داگیرکردنی ژاپۆن.

## جەنگی ئەوروپی لە ١٩٤١ تا ١٩٤٥

تا ساڵی ١٩٤١ ئەڵمان بەشێکی زۆری ئەورپای خستە ژێردەسەڵاتی خۆی. لە ٢٢/٧/، ئەڵمان بە بەهێزترین لەشکرەوە هێرشی بردە سەر ڕوسیا. ئامانجی هیتلەر شکستی هەرچی خێرای ڕوسیا و داگیرکردنی ئەو وڵاتە بوو. لەسەرەتادا، ئەڵمانیەکان سەرکەوتوو بوون و چەندین ناوچەی گەورەی لە ڕوسیا داگیر کرد بەلاَم نەیتوانی تا گەیشتنی زستانی سارد و سەخت شارە گرینگەکان داگیر بکات. سوپای تازە نەفەس و ڕێکخراوی ڕوسیاش دەجەنگان و ڕێگیر بوون لە پێشڕەوی ئەڵمان. ڕوسیا لە ستالینگراد ئەڵمانی گەمارۆدا و بە هۆی جەنگێکی قورس لە ڕێگای تانکەوە لە ناوچەی *کورسك* لە ساڵی ١٩٤٣ کەم کەم پاشەکشەی بە ئاڵمان کرد.گەرچی ئەمریکا بێلایەن بوو بەلاَم کەشتی، چەك و مادەی خاوی بۆ بەریتانیا و ڕوسیا دەنارد. ئەمریکا، هەروەك لە جەنگی جیهانی یەکەم نەیدەویست ئەوروپا لە ژێر دەسەڵاتی وڵاتێکی سەربازی بەهێز بێت. لە کۆتایەکانی ساڵی ١٩٤١ ئەمریکاش هاتە ناو جەنگەکەوە دژ بە ئاڵمان. ئەڵمان ئیتر نەیدەتوانی بەرامبەر دوو زلهێزی سەنعەتی، ئومێدی سەرکەوتنی هەبێت.

لە ساڵی ١٩٤٣ هێزە تەوەریەکانی (ئەڵمان و ئیتالیا) لە باکوری ئەفریقا شکستیان خوارد. ئیتالیا تەسلیم و دواتر داگیرکرا. زۆرێك لە ئیتالیایەکان لەم بارودۆخەدا دژ بە




**بۆمبی فڕۆکەی ڤی ١کە لە ساڵی ١٩٤٤ لە لایان ئەڵمانەوە دژ بە بەریتانیا و بەلجیکا سوودی لێوەردەگیرا. ڤی ١ توانای هەڵگرتنی یەك تۆن مادەی تەقەمەنی هەبوو و بە خێرایی ٥٠٠ کم لە کاتژمێرێکدا دەفڕی. و خرجیەکەی زۆر کەم بوو. ئەڵمان سوودی لە موشەکی ڤی ٢ ش وەرگرت. خێرای ئەم موشەکە ئەوەندە زۆر کە فڕۆکە ناتوانێ ڕێگری لێ بکات.**

ئاڵمان دەجەنگان. ڕۆسیا، لە هەموان زیاتر باری جەنگی لە ئەوروپا لە ئەستۆ بوو. لەبەرئەوە داوای لە بەریتانیا و ئەمریکا کرد کە بەرەی دووەم دروست بکەن دژ بە ئاڵمان. ئەم داواکاریە لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٤٤ کەوتە بواری جێبەجێکردنەوە: واتە کاتێك هاوپەیمانانی ڕۆژئاوا لە باکوری فەڕانسە جێگیرکران. لەوکاتەدا سوپای ئەڵمان لە ڕوسیا دەجەنگا. حوکمڕانی نازیەکان لە ئەوروپای ژێردەستیان زۆر وەحشیگەریانە بوو. ئەو ئەڵمانیانەی کە دەیانویست پاشەکشە بکەن لە یوگسلاوی وفەڕانسە دووچاری هێرشی بە هێزی پارتیزانەکان بوونەوە. تا بەهاری ساڵی ١٩٤٥ سوپاکانی ڕوسیا و بەریتانیا و ئەمریکا توانیان ئەڵمان شکست پێ بهێنن و داگیری بکەن.

## جەنگ لە ئاسیا و زەریای هێمن (لە ١٩٤١ تا ١٩٤٥)

ژاپۆنیەکان تا ساڵی ١٩٤٢ بە هۆی زنجیرەیەك جەنگی یەك لە دوای یەك، ناوچەیەکی بەرفراوانیان لە ناوچەی باشوری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا داگیرکرد. دواتر ژاپۆن هەوڵی دا پێشڕەویەکانی لە سێ لاوە بەردەوامی پێ بدا. هەوەڵ ئەوەیکە ژاپۆن دەیوست لە ڕێگای بۆرماوە هێرش بەرێتە سەر هیندستان ، بەڵام لە کۆتاییدا بە هۆی سەربازانی هیندی و ئەفریقای وبەریتانی لە بۆرما شکستیان بە ژاپۆن هێنا. دووەم ئەوەی کە ژاپۆن نەخشەی کێشا بوو کە



**یەکێك لە ٥٠ وێسگەی ڕادار لە باشوری ڕۆژئاوای ئینگلتەرا لە ساڵی ١٩٣٩. ڕادار کە لە دەیەی ١٩٣٩ پێشکەوتنی بەرچاوی بە خۆیەوە بینی، ڕادار سوودی ئەوەی هەوبو بەر لەوەی فڕۆکەکانی دوژمن نزیك بنەوە خەبەری دەدا.**

**هێرش بەرێتە سەر خاکەکانی باکوری ئوسترالیا و واداری بکات خۆی لە جەنگ بکێشێتەوە. ئەمەش هەر بەشکست کۆتایی هات. لەبەرئەوەی سێهەمین نەخشەشی بۆ زەریای هێمن لە لایان ئەمریکاوە شکستی هێنابوو. لە چەندین هێرشی دەریایی پیشڕەویەکانی ژاپۆن شکستی هێنابوو. لەم جەنگانە چەکی سەرەکی فڕۆکە بوو کە لەسەر کەشتیە فڕۆکەهەڵگرەکانەوە دەفڕین.**

**ژاپۆن، ئەوەندە خێرا پێشڕەوی دەکرد کە ڕێژەی بەرهەمهێنانی پێداویستی جەنگی بەشی نەدەکرد. کاتێك ئەمریکا هێزی گەورەی پیشەسازی خۆی خستە کار، شکستی ژاپۆن هیچ گومانێکی لەسەر نەما. لەشکرەکانی ژاپۆن زۆر بە سەرسەختانە دەجەنگان بەڵام کەم کەم لە دورگەکانی زەریایی هێمن پاشەکشەیان کرد.**

**ئەمریکا هاوکاری سەربازی نارد بۆ چین" هێزەکانی کۆمونیست و ناسیۆنالیستی چینیش دژ بە هێرشەکانی ژاپۆن هاوکاریان دەکرد. هەتا ناوەڕاستی ١٩٤٤ ئەمریکیەکان هەموو ئەو دورگانەیان داگیر کرد کە نزیك بوون بە ناوەندی هەوایی ژاپۆن. لەو کاتە بەدواوە شارە ژاپۆنیەکان بە توندی بۆمباران دەکران و ژێردەریایەکانیش کەشتیە بازرگانیەکانی ژاپۆنیان لەناوبرد. لە کۆتایدا ژاپۆن لە ١٩٤٥/٨ لە پاش بۆمبارانی ئەتۆمی خۆی ڕادەست کرد.** **(بگەڕێوە بۆ کتێبی بۆمبی ئەتۆمی لەم زنجیرەیە)**

## جەنگی تەواو

لە جەنگی جیهانی دووەم، هەتا زیاتر لە جەنگی جیهانی یەکەم، وڵاتان هەموو هێزە مرۆی و پیشەسازیەکانی خۆیان بۆ -جەنگێکی تەواو- ئامادە کرد. لە ساڵی ١٩٢٠ حکومەتەکان کۆنترۆڵی زیاتریان بە سەر بابەتی ئابووری بەدەست هێنا بەتایبەت ڕوسیای کومونیست و ئاڵمانی نازی. ئەم ڕاستیە و تەجروبەی جەنگی جیهانی ئەوەلیش بووە هۆی کارئاسانی لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی جەنگ. خەڵکانی ئاسایی بە هۆکاری جیاواز زیاتر لە جەنگی جیهانی هەوەڵ بژداریان لە جەنگی جیهانی دووەم کرد. هۆکاری یەکەم، کاریگەری ژیانی کرێکارەکان بوو لە کاروباری جەنگی، و دەرئەنجامی ئەم کارەش کاری بەرنامەدارێژراو بوو بۆ هەموان. ئاڵمان بۆ پڕکردنەوەی کەمبودی کرێکاری پێویست، کرێکاری دەرەکی لە وڵاتەکانی ژێردەستی دادەمزراند. هۆکاری دووەم بۆمباران کردنی شارە پیشەسازیەکانی دوژمن بوو بە مەبەستی لەکارخستنی ڕێژەی بەرهەم هێنانی پێداویستیەکان، کە ئەمەش ڕێگەیەکی نویٚ بوو. لە دوای ساڵی ١٩٤٣ سەدان هەزار نەفەر لە کەسانی مەدەنی بە هۆی بۆمبارانەکانی بەریتانیا و ئەمریکا لە شارەکانی ژاپۆن و ئەڵمان کوژران. سێیەم ئەوەی کە جەنگی جیهانی دووەم، جەنگێکی وەحشیانە بوو. ژمارەیەکی زۆر کەسی مەدەنی و زندانیانی جەنگ بە بیٚ هۆکار کوژران یان بە هۆی برسێتیەوە مردن. نزیکەی ٦ ملیۆن یەهودی و ملیۆنان سلاڤی بە دەستی نازییەکان کوژران. ژمارەی کوژاوەکانی ڕوسیا کە زۆربەیان خەڵکی مەدەنی بوون نزیکەی ٢٠ ملیۆن کەس بوو. لە پاش تەواو بوونی جەنگ سەربازە ژاپۆنیەکان و ئەڵمانیەکان و کەسانی مەدەنی کە تاوانی جەنگیان درابووە پاڵ دادگایی کران. بەرهەم هێنانی کەرەستەی جەنگی ڕەونەقێکی بەخشیەوە بە زۆرێك لە پیشەسازییەکان. سنعەتی پۆڵا، کەشتی سازی، ڕێگاو بان و تەلارسازی، کەرەستەی جەنگی و کەرەستەی ئەلیکترۆنی و کشتوکاڵ هەموویان لە سەردەمی جەنگ گەشەیان کرد. لە ئاڵمان و وڵاتانی دیکە، بەر لە جەنگ سنعەتی وەربهێنانی نەفت ئاسایی نەبوو، و پلاستیکی دەستکرد بە ڕێژەیەکی کەم بەکاردەهێنرا. لە سەردەمی جەنگ هەندێك لە سنعەتەکان لە جێگای نویٚ سەریهەڵدا، بۆنموونە کشتوکاڵ لە باشوری ئەمریکا. ئەڵمان و ڕوسیا پیشەسازیەکانی خۆیان لە ناوەڕاستەوە گواستەوە بۆ ئەوەی پارێزراو بن لە بۆردومانەکان. لە دوای ساڵی ١٩٤٢ زۆربەی بەرهەمەکانی جەنگی ڕوسیا لە کارگەکانی *چیای ئوراڵ* دەهاتە بەرهەمهێنان کە دوور بوون لە مەترسی ئەڵمانیەکان.

لێکۆڵینەوەی زانستی لەسەردەمی جەنگ بەرەو پێش چوو. زۆرێك لە چەکەکان کە لەسەردەمی جەنگی جیهانی یەکەم دروستکرابوون، لە کاتی جەنگی دووەمی جیهانی تەواوکاریان بۆ کرا" تانکەکان گەورەتر، خێراتر و بەهێزتر کران" ژێردەریایەکان دەیانتوانی بۆ ماوەیەکی زیاتر لە ژێر دەریا بمێننەوە" فڕۆکەکان خێراتر کران و توانای هەڵگرتنی چەکی قورستر و ویرانکارتریان بۆ زیاد کرد. ڕادار، موشەکە بێناوەکانی ئەڵمان و بۆمبی ئەتۆمی هەموو ئەمانە لە بەرهەمەکانی لێکۆڵینەوەی زانستی سەردەمی جەنگن کە بە هۆی پاڵپشتی دارایی وڵاتان مسۆگەرکران. هەروەها زۆرێك لە پێشکەوتنە گرنگەکانی وەکو دەرمان بۆنموونە پەنسلین و چارەسەری نەخۆشی پێست کە گیانی هەزاران نەفەری ڕزگار کرد لە کاتی جەنگ گەیشتە لوتکە.

## جیهان لە دوای جەنگ

لە ساڵی ١٩٠٠ بارودۆخی دونیا لە ژێر دەستی زلهێزەکانی ئەوروپا بوو. لە ساڵی ١٩٤٥ دوو زلهێز پەیدابوون-یەکەمیان ئەمریکاو دووەمیان ڕوسیا. ئەم دوو زلهێزە لە ڕووی دارایی، سیاسی و سەربازی ئەوەندە بەهێزبوون کە هیچ دەوڵەتێکی دیکە زاتی ئەوەی نەدەکرد خۆ لە قەرەی ئەمانە بدات. ئەمریکا

و ڕوسیا شکستیان بە ئەڵمان و ژاپۆن هێنابوو و پێداگریان لەسەر ئەوە دەکرد جڵەوی دۆخی جیهان هەر لە دەستی ئەواندا بمێنێتەوە. ئەم بابەتە دوژمنایەتی زۆری لێکەوتەوە. (بگەڕێوە بۆ کتێبی جەنگی سارد لەم زنجیرەیە) ڕوسیا سنورەکانی خۆی فراوانتر کرد بەروە ڕۆژئاوای ئەوروپا و لە وڵاتانی سەر سنوور چەندین حکومەتی کومونیستی دروست کرد. هەروەها لەشکری ئەمریکاش لە ئەوروپا مایەوە.

لە دوای جەنگ، هێزەکانی ئەوروپا نەیانتوانی کۆنترۆڵی تەواوی ناوچە موستەعمەریەکانی ئاسیا بە دەست بێننەوە و ڕووداوی پاشەکشەو سەربەخۆی نەتەوەی سەرهەڵدا. (بگەڕێوە بۆ کتێبەکانی ناسیۆنالیزمی هیندی و ناسیۆنالیزم لەم زنجیرەیە) فەڕانسەو بەریتانیاش هێزەکانی خۆیان لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کێشایەوە. سوریا، لوبنان و ئوردن بەتەواوی سەربەخۆیان بەدەستهێنا. یەهودیەکانی ئەوروپا دەوڵەتێکی نوێیان بە ناوی ئیسرایل دروست کرد.

لە کۆتایی جەنگ زۆربەی پیشەسازیەکانی ئەوروپا لە ناوچوبوون. ملیۆنان پەناهەندەی جەنگ بێ حاڵ و ماڵ بوون. نەتەوە یەکگرتووەکان هاوکاری دارایی ئەو وڵاتانەی کرد بۆ ڕێکخستنەوەی سنعەتی وڵاتەکانیان. بەشێك لەم هاوکاریانە بە خۆڕایی بوو، بەڵام بەشە زۆرەکەی وەکوو قەرز بوو کە دەکەوتە سەر قەرزەکانی پێشتریان. سیاسەتمەدارانی جیهان ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی ڕێکخراوێکی دیکە نێونەتەوەی لە جیاتی کۆمەڵەی نەتەوەی دروست بکەن. .ڕێکخراوێك کە کاریگەری هەبێت لەبەرگرتن لە دروست بوونی جەنگ. لە ساڵی ١٩٤٥ ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان دروستکرا. وڵاتانی شکستخواردوو بە خێرایی داوای بە ئەندامبونیان کرد. ڕێکخراوەکە سوپایەکی پێکهێنا تێکەڵەیەك لە لەشکری وڵاتانی ئەندام.

دوو جەنگی جیهانی، پەیوەندی نێوان نەتەوەکانی گۆڕی. هەروەها گۆڕانکاری خێرای کرد لە کۆمەڵگە ناوخۆیەکانی زۆرێك لە نەتەوەکان. هەندێك حکومەتی تایبەت لە سەردەمی جەنگی جیهانی دووەم، دەسەڵاتیان بەسەر ژیانی خەڵکەوە فراوانتر کرد. لەپاش جەنگ بەشێکی زۆری ئەم کۆنترۆڵکردنە هەروا مایەوە بەتایبەت لە بواری ژیانی ڕەفا و خزمەتە کۆمەڵایەتیەکان و هەروەها بەشێکی زۆریش لە بەرهەمە پیشەیەکان. (بگەڕێوە بۆ کتێبی گەشەی دەوڵەت لەم زنجیرەیە)

ئەگەر بمانەوێ ئەنجامی جەنگە جیهانیەکان لە یەك ووشە کورت بکەینەوە، ئەو ووشەیە بریتیە لە "ڕێکخستنەوە". کوشتاری خەڵك، وێرانکاری کارخانەکان و خراپ کردنی ماڵی خەڵك مەترسیداربوون، بەڵام زیانەکان زۆر بەزووی قەرەبوو کرانەوە. نەخشەی سیاسی جیهان گۆڕانکاری بەخۆیەوە بینی و حکومەت و وڵاتانی نوێ جێگای حکومەتە کۆنەکانی گرتەوە. بەر لە ساڵی ١٩٠٠ بۆ زۆرێك لە خەڵکی تەواو ڕوون بوو کە ڕوسیا و ئەمریکا بە هۆی جەنگ یان بە بێ جەنگیش تەنها بە بەڵگەی زۆرسادەی وەکوو، زۆر بوونی دانیشتوان و سەرچاوە مرۆیەکان، زانست، مادەی خاو لە ئاستی نەتەوەی ونێو نەتەوەیی، لە کۆتاییدا هەر دەبن بە دوو وڵاتی زلهێزی دونیا. جەنگە جیهانیەکان زیاتر لە هەر شتێکی دیکە ژیانی خەڵکیان ئاوەژووکردەوە.

**کتێبە بڵاوکراوەکانی ئەم زنجیرەیە:**






















